# ژياننامەی ئيمامی

# شافعی

## ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت




ئامادەکردنی

مامۆستا خليل أحمد


=======================================


لە بڵاوکراوەکانی سايتی بەهەشت

www.ba8.org




1428 - 2007

سوپاس وستایش بۆخوا، درودوسلاو بۆسەرگیانی پێغەمبەر(ﷺ) وەبۆسەر گیانی کەس وکارو هاوەڵانی وشوێن کەوتوانی. بەڕاستی ناودارانی ئیسلام ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاویان هەبووە لەخزمەتکردن وهۆشیارکردنەوە وچاکسازی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا، هەمووژیانیخۆیان تەرخان کردبوو بۆخزمەتکردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و ئاشناکردنی کۆمەڵانی خەڵك لەم ئاینە پیرۆزە،تەنهابە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا ،دورلەهەولدان بۆ دەسخستنی پلەوپایەی ژیانی دونیاو تێرکردنی بەرژەوەندی کەسی، جا خوێندن و زانینی ژیاننامەو ئەزمونی پرشنگداری هەریەك لەناودارانی ئیسلام گەلێك سود بەخش و بایەخدارە. بەتایبەت بۆئەوەی ببێتە دەرسێکی زیندو و واقیعی بۆئەمڕۆی ئێمەی شوێن کەوتوو ، هەروەهاژیاننامەی ناودارانی ئیسلام پاڵنەرێکی گرنگ و کاریگەرە، بۆچاولێکردن وخۆڕازاندنەوە بەوخووڕەوشتە بەرزانەی ئەوان هەڵیانگرتبوو ،لەبەرهەمووئەمانە دەچینە ناو گولزاری ژیاننامەی کەسایەتیەکی مەزن لە ناودارانی ئیسلام کە بریتیە لە ئیمامی شافیعی ڕەحمەتی خوایلیٚ بیٚ.

## ناوو نەسەبی شافعی

شافعی ناوی :محەممەدی کوڕی ئیدریسی کوڕی عەبباسی کوڕی عوسمانی کوڕی شافع ی کوڕی (السائب)ی کوڕی عوبەیدی کوڕی عەبد یەزیدی کوڕی هاشم ی کوڕی (المطلب)ی کوڕی (عەبد مەنناف)ی باپیرە گەورەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)[1]، واتە پێشەوا شافعی بە نۆ پشت دەگاتە وە سەر (عەبدمەنناف) لێرەوە خزمایەتی نێوان شافعیو پێغەمبەری خوا(ﷺ) وقورەیشێتی شافعیمان بۆ دەر دەکەویٚ.

## شوێن وساڵی لە دایك بوونی

ئیمامی شافعی لە ساڵی (١٥٠ )یکۆچی بەرامبەر(٧٦٧ )یزاینی لەشاری غەززە لە فەلەستین لە دایك بووە، هەرلەو سەفەرەیدا دوای لەدایکبوونی شافعی بەماوەیەکی کەم مردوەو ونەگەڕاوەتەوە ، بۆیە شافعی بەهەژاری و بیٚ باوکی لای دایکی ژیاوەو گەورەبووە لەتەمەنی دووساڵیدا –دایکی _ژیروکارزان وتێگەیشتوویی –_ کۆرپە ساواکەی بردووەتەوە

[1] بڕوانە (تاریخ الاسلام )ی ئیمامی الذهبی ب ١٤ ل ٣٠٤ ،سیر اعلام النبلاء ب ١٠ ل ٥ الجرح والتعدیل ب ٧ ل ٢٠١ تهذیب الکمال ب ٦ ل ٢٠٩ البدایة والنهایة ب ٥ ل ٦٩١ هەروەها چەندین سەرچاوەی باوەڕ پێکراویتر.

بۆ شاری مەککە _شاری دێرینی باووباپیرانی شافعی[2]، شافعی هەر لەتەمەنی منداڵیدا پێش (بالغ ) بوونی قورئانی پیرۆزی لە بەرکردووە، لەدوای دابەزین ونیشتەجیبۆون لەمککە ،شافعی ئەوەی هەڵبژارد کەبچێتە دەرەوەی مەککە بۆناو هۆزە کانی تر لەدەرەوەی شاری مەککە ،لەمیانەی ئە م دەرچونەی لای هۆزی (هوزەیل) دابەزی ، ئەوهۆزەی کەوا ناوبانگی بەزمان پاراوێتی وڕەوانبیژی و ئەدەبزانی دەرکردبوو ،بۆیە (١٧ ) ساڵی تەواو لەناو ئەم هۆزەدا مایەو. لەئەنجامدا بووبە ئەدیب وزانایەکی گەورەو لێهاتوو لە بارەی زمان وڕەگەز ناسیدا

## ژیان وخوێندن و پێگەیشتنی

غەززە شوێنی لەدایك بوونی ئیمامی شافعی یە ، بەلاّم جێگای باب و باپیرانی شافعی نەبووە بەڵکو ئیدریسی باوکی بەمەبەستی ئەنجامدانی کارێك ڕۆیشتبوو بو ئیمامی شافعی بۆخۆی دەڵیٚ (لەمەککە دەرچووم بۆناوهۆزەکانی تر لەدەرەوەی مەککە ،لای هۆزی(هذیل) دابەزیم ومامەوە لەگەڵیان دا ژیام بەمەبەستیفێربوونی زمان وئاخاوتنیان ، لەوکاتەدا (هذیل) لەهەموو هۆزەکانی عەرەب زمانپاراوو ڕەوانبێژتر بوون) لەمیانەیژیانبەسەربردن ومانەوەی لە (هذیل) دادەبەزی بۆشاریمەککە بەمەبەستی دەستخستنی زانستی شەرعی لای زانایان ،پاشان دەگەڕایەوە ناو (هذیل) بەم شێوەیە بەردەوام بوولەگەڕان بەدوای زانستی شەرعی و وەرگرتنیدا، لەم کاتەی کەواشافعی سەرقاڵی گەڕان بوو بەدوای زانستیشەرعیدا چاوی کەوت بەشێخ وموفتی حەرەمیمەککە (موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی )[3]، شایانیباسە شافعیسودێکی گەورەی لەوپێشەوایە وەرگرت بەردەوام بوو تاوای لێهات مۆڵەتیدا کەفتوابدات .پاشان ئیمامی شافعی ڕەحمەتی خوایلیٚبیٚ داوای لەمامۆستاکەی ( موسلیم )کرد کەنامەیەکی بۆبنوسێت بۆمالیکی کوڕی ئەنەس پێشەواو فەرمودەناسی مەدینەی شاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵیٚ :ئەویش بۆی نوسی، ئیمامی شافعی بەڕێکەوت بۆ مەدینە تاگەیشتە لای ئیمامی مالیك ،ئەوەشمان لەیاد نەچیٚ ئیمامی شافعی پێشوەخت کتێبی (موطا)ی دانراوی ئیمامی مالیکی لەبەرکردبوو کەتەمەنی (١٣

---

[2] تاريخ التشريح الاسلامى ل١٨٤.

[3] بڕوانە تاريخ التشريع الاسلامى ل ١٨٤.

)سالآن بوو بۆیە لەسەر داوای ئیمامی مالیك (موطا)ی خوێندەوە بەسەر ئیمامی مالیكدا بۆیە خوێندنەوەی ئیمامی شافعی لای ئیمامی مالیك زۆر سەرسوڕهێنەربوو.

ئیمامی شافعی لەسەرەتای دەستپێكردنی زانستی شەرعیدا فیقهی موسلیمی كوڕی خالیدو حەدیسی دووكەسایەتی مەزنی حیجازی بەدەستهێنا كەبریتی بوون لەسوفیانی كوڕی (عیینە )ی فەرمودەناسی مەككەو مالیكی كوڕی ئەنەسی فەرمودەناسی مەدینە ، لێرەدا بۆمان دەركەوت ئەم دوو كەسایتیە بەمامۆستا گەورەكانی ئیمامی شافعی دادەنرێن.

بەلآم وە نەبێ ئیمامی شافعی تەنها سوودی لەم دوو كەسایەتییە وەرگرتبێ وبەس، نا بەڵكو فقە وحەدیسی لە زۆر كەسانی ترەوە وەرگرتووە وەك(داوودی كوڕی عەبدولرحمان و عەبدولعەزیزی كوڕی ئەبو سەلەمەی ماجیشۆن و ئیبراهیمی كوڕی سەعدو محەممەدی كوڕی ئەلحەسەنی فەقیە و ئیسماعیلی كوڕی عُلیە و....كەسانێكی زۆری تر جگە لەمانە[4]، بەلآم پەیوەندی ئیمامی شافعی بە ئیمامی مالیكەوە پەیوەندیەكی پتەوو بەهێز بوو بۆیە مەقامی ئیمامی مالیك لەدڵی ئیمامی شافعیدا لە پێشەوەبوو.هەروەها كتیبێ(الموطا)ی مالیك لای شافعی پلە وپایە یە كیبەرزی هەبوو تەنانەت لەپاش قورئانی پیرۆز بەڕاسترین كتێبی حیسابدەكرد، بۆیە دەیگوت (لەگۆی زەویدا هیچ كتێبێك نیە لە (الموطأ) ڕاستی زیاترتێدا هەبێ)[5]، واتە : صەحیح بێ، بۆیە هاوەڵێتی شافعی بۆ مالیك درێژەی خایاند تا ئەوكاتەی ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێ بێ وەفاتی كرد لەساڵی(١٧٩)ی كۆچی ، ئەوكاتە تەمەنی شافعی (٢٩) ساڵبوو ، نزیكەی (٩) ساڵ لای مالیك مایەوە تابەیەكێ لەهاوەڵەكانی مالیك دادەنرا بەڵام دوای وەفاتی مالیك ، شافعی ناچار لەوێ نەمایەوەو رۆشت بو یەمەن ، شافعی خاوەنی ماڵ و سامانێكی زۆر نەبووە ، بۆیە دەگەڕا بەدوای كارێكدا پێی بژێت ، بۆ ئەم مەبەستە (مصعب)ی كوڕی عەبدولڵای (القرشی) قازی یەمەن یارمەتیدا بۆ ئەوەی لەیەمەن كارێكی بخاتە ژێردەست ، ئەنجامیش ئەوەبوو كارێكی پێسپارد وماوەیەكیش بەردەوام بوو لەسەری . ئەوەشمان لەیاد نەچێ شافعی لەیەمەنیش سودیلە( لیث)ی كوڕ سەعدی شەرعزانی میسر وئەوزاعی شەرعزانی شام وەرگرت. لەساڵی (١٨٤ )ی كۆچی ، ئەوكاتەی

[4] بڕوانە تاریخ الاسلام ب ١٤ ل ٣٠٥.

[5] بڕوانە اداب الشافعی ومناقبە ل ١٩٦ — ١٩٧.

(هارون)ئەلڕەشید خەلیفەی موسڵمانان بوو، شافعی تووشی مەینەت و تاقیکردنەوەیەکی قورس وگران کرا تۆمەتکرا بەوەی گوایە ڕەخنەی لەدەسەڵاتی عەبباسیەکان گرتوەو شیعەگەرێتی دەکات[6].

بەم بۆنەیەوە ڕەوانەی بەغدادکرا بۆلای ئەلڕەشید،بەلاّم لەبەرئەوەیئەم تۆمەتە لەڕاستیەوە دوور بوو شافعی ڕزگاری بوو نەك هەرئەوەش بەڵك و لەمیانەی ئەم ناردنە ی بۆبەغداد چاوی کەوت بەمحە ممەدی کوڕی ئەلحەسەنی شەیبانی ودوای ڕزگار بوونی لەومەینەتە .زانیارییەکی باشی لەو کەسایە تیەیە وەرگرت وکتێبەکانی نوسییەوە، هەروەها چاویکەوت بەوکتێبانە کەلە عێراقدا هەبوون و لەبابەتی فیقهەوە نوسراوبوون ،شافعی بەم هەوڵەی توانی زانیاریەکانی هەردوو قوتابخانە بەناو بانگە کەی ولاّتانی ئیسلام قوتابخانەی حەدیس لەحیجازو قوتابخانەی (را ی و قیاس) لە عێراقدا کۆ بکاتەوە . دوای ئەوەی شافعی لەومەینە تە قورسە ڕزگاری بوو زانیاریە کی گەورەی بەدەست هێنا ئەنجا گەڕایەوە بۆحیجاز ، تاماوەیەك لەشاری مەککە سوودی وەردەگرت ودەیگەیاند چو نکە مەککەجێگای بەیە کگەیشتنی زانایان بوولە هەموو هەرێمەکانەوە ، ئیمامی شافعیش تێکەلاّوی دەکردن ولیَی دەردەگرتن ولێیان وەردەگرت مونازەرەشی لەگەڵ دەکردن بەم شیوە یە بەردەوام تا ئەوەی بۆ دروست بوو، جاری دووەم سەرداتەوە لە عێراق لە ساڵی (١٩٥)ی کۆچی ،بۆیە بەرێکەوت بۆ عێراق ،ئەم جارەیان جیاواز بوو لەویتر یان ئەمجارە کۆمەڵێ لەزانایانی عێراق سوودیان لیَوەرگرت، وەکو ئیمامی ئەحمەدوعەبدولڕحمانی کوڕی مەهدی، ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی ئەڵێ (پێش هاتنی شافعی ئێمە ناسخ ومەنسوخ مان نەدەزانی شایانی باسە ئیمامیئەحمەد زۆر پەیوەست بوو بە شافعی یەوە وبەنوێکەرەوەی سەدەی دووەمی حساب دەکرد دەیفەرموو(یروی فی الحدیث ان الله یبعث راس کل سنة من یصحح لهذه الامة دینها فنزرنا فی المئة الاولیفازا هو عمر بن عبدالعزیز ونزرنا فیالمئة الثانیة فنراة الشافعی)[7]. ئەم جارە محەممەدی کوڕی ئەلحەسەن وەفاتی کردبوو هەروەها (هارون) یش وەفاتیکردبوو ،شافعی ئەم جارەیان دووساڵ مایەوە پاشان جارێکی ترگەڕایەوە بۆحیجاز بەلاّم دەنگ

---

[6] تاريخ التشريع الاسلامی ل ١٨٤ – ١٨٥ .

[7] انظر : صفة الصفوة(٢/٢٥٠).

وباسی لەهەموو بەغدادا بلأو بووبووەوە، زۆربەی زانایانیش شوێن بیرو ڕاکانی کەوتبوون . هەروەها بۆجاری سێیەم گەڕایەوە بۆعێراق چەند مانگێك مایەوە ئەنجا لەساڵی(١٩٩)ی کۆچی سەفەریکرد بۆمیسروله (فسطاط) بەمیوانی لای عەبدوڵلای کوڕیعەبولحەکەم دابەزی.

لەوێ لەمزگەوتی (عەمری کوڕی عاص) دەستیکرد بە وتنەوەی وانەکانی فیقە وحەدیس بەیانیان دەستی دەکرد بە وتنەوەی قور ئان دوای ئەوەش حەدیس و پاشان موناقەشەو سەرنجدانی حوکمە فیقهیەکان هەروەها گرنگی ئەدا بەوتنەوەی زمانی عەرەبی کەدەستێکی بالأی هەبوو تیایدا بەڵکو سەرچاوە بوو بۆ زمانی عەرەبی وەکو ·· ئەبوعوبەیدەی ئەلقاسمی کوڕی سەلام ئەڵێ /شافعی یەکێ بوو لەوانەی زمانی لێ وەردەگیرا· هەروەها ئیبنو هیشام خاوەنی مەغازی ئەڵی· شافعی یەکێ بوو لەوانەی زمانی لێ وەردەگیرا ، لە میسر تواناکانی شافعی دەرکەوت و هەموو کتێبە تازەکانی بە قوتابیەیە میسریەکان خوێندەوە ئەمەش پێی دەگوترێ مەزهەبی میسر یان مەزهەبی تازەی شافعی رەحمەتی خوای لێ بێ·

## مشتێك لە خەرواری سیفاتەکانی شافعی

**خۆبەکەم** زانین وتەسلیم بوونی بۆ حەق، ڕەبیعی کوڕی سولەیمان دەڵێ (گوێم لە شافعی بوو گوتی : پێم خۆشە خەڵکی ئەم زانستەی من – واتە کتێبەکانی– فێربن و بیزانن بۆ ئەوەی هیچ لەوانە نیسبەت نەدرێت بۆ لای من و بەناوی منەوە نەبێ، هەروەها ڕەبیع دەڵێ ·· لە شافعیم بیست دەیگوت: موناقەشەی هیچ کەسێکم نەکردووە بەمەبەستی سەرکەوتن بەسەریدا بەڵکو تەنها بەمەبەستی دەرخستنی ئەو حەقەی پێمە[8] لەکاتێکدا شافعی وەکو هیچ کەسێکی تر نەبووە لەمونازەرە کردندا کەزۆر بەهێز بووە لەو بوارەدا وەکو محەممەدی کوڕی عەبدوڵلأی کوڕی عەبدولحەکەم ئەڵێ : هیج کەسێکم نەبینیوە شافعی مونازەرەی لەگەڵ بکات ئیللا بەزەیم بەو کەسەدا هاتوەتەوە[9]، هەروەها ئەڵێ · گەرببینیت ئەوکاتەی

[8] سير اعلام النبلاء ب ١٠ ل ٢٩.

[9] تأريخ الاسلام ب ١٤ ل ٣١٧.

شافعی مونازەرە دەکات وادەزانی شێرێکەوپەلاماری خواردن دەدات ئەوبوو خەڵکی فێری بەڵگەو بەڵگە خوازی کرد[10]

## عیبادەت وشەونوێژی شافعی

ڕەبیعەی کوڕی سولەیمان ئەڵێ : شافعی شەوگاری کردبوو بە سێ بەشەوە سێیەکی یەکەمی دەینوسی ، بەشی دووەمی نوێژی دەکرد ،بەشیسێیەمی دەخەوت . ئیمامی (الذهبی) ئەڵێ :هەرسێ کردارەکەی لە گەڵ مەبەستدا عیبادەت و پەرستشە بۆخوا .

## سەخاوەتی شافعی

ئەبوو (ثور) ئەڵێ کەم جار شافعی شتی لای خۆی ئەهێشتەوە لەبەرچاوتێری عەمری کوڕی سەوواد ئەڵێ :شافعی سەخیترین مرۆڤە بۆدینارودرهەم وخۆراك بەخشین ، شافعی پێی ووتم : لەژیانمدا سێجار ئیفلاسم کردووە ،تەنانەت کەم و زۆری ماڵی خۆمم فرۆشتووە تەنانەت خشڵی خێزان و کچەکەشم وەهەرگیز ڕەهنم نەکردووە، ڕەبیع ئەڵێ :لایشافعی ووتم ژنم هێناوە ئەویش پرسیاری لێکردم گوتی چەندت کردوە بەمارەیی منیش گوتم (٣٠)دینار، شەش دینارم پێشەکی داوە کەئەمەی بیست (٢٤) دیناری پێشکەش کردم بۆتەواو کردنی ئەو مەبلەغە . ڕەبیع ئەڵێ :کابرایەك نامەیەکی دا بەشافعی تیایدا نوسرا بوو ، من کابرایەکی سەوزە فرۆشم تەنها یەك درهەمم هەیە ژنیشم مارە کردووە جایارمەتیم بدە ئەویش لەوەڵامدا گوتی ڕەبیع (٣٠) دینارم پێبدە و داوای گەردن ئازادی لێبکە بۆم. منیش گوتم ئەم کابرایە تەنها (١٠) درهەمی بەسە گوتی (ویحك) ئەوەی بدەرێ .

## شایەتی وستایشی زانایان لەسەر ئیمامی شافعی

حارسی کوڕی سورەیج ئەڵێ : گوێم لە یەحیای کوڕی (القطان) بوو دەیگوت (من بەتایبەت پاڕانەوە لای خوا بۆ شافعیدەکەم)، ئەبووبەکری خەللاد ئەڵێ:من لەپاش نوێژەکانم پاڕانەوە لای خوا بۆشافعی دەکەم، مەیمونی ئەڵێ: گوێم لێبوو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەیگوت شەش کەس هەن لەسەحەردا دۆعایان بۆدەکەم یەك لەوانە شافعییە.

(ابو ثور) ئەڵێعەبدولڕحمانی کوڕی مەهدی پێی گوتم هیچ نوێژێك ناکەم ئیللا لە نوێژەکەمدا لەخوا دەپاڕێمەوە بۆشافعی .

---

[10] تأريخ الاسلام ب١٤ ل٣١٧.

فەزڵی کوڕی زیاد : گوێم لێ بوو ئەحمەد دە یگود(هیچ کەس نیيە پێنوس ومەرەکەبی بەدەستەوە گرتبێ ئیللا شافعی مننەتی لەگەردنی ئەو کەسەدا هەیە.

## بیروباوەڕی شافعی

ڕەبیع ئەڵێ گوێم لێ بو شافعی دەیگوت: باوەڕ بریتیە لە ووتەو کردەوە، زیاد دەکاو کەم دەبێ. شێخی ئیسلام عەلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی یوسف ی هەکاری لە کتێبی (عقیدە الشافعی) دا ئەڵی (یونسی کوڕی عەبدولئەعلا ئەڵێ: شافعی پرسیاری لێ کرا دەربارەی سیفاتی خوا و ئەوەی خۆی باوەڕی پێیەتی، بیستم لیێ گوتی خوای گەورە چە ندین ناو و سیفاتی هەیە لە قورئاندا هاتووە،هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) هەواڵی ئەوەی ئوممەتەکەی ڕاگەیاندووە کەوابوو کەسێ بەڵگەی پێگەیشتبێ بۆی نیە ڕەت یکاتەوە قورئان باسی ناووسیفەتەکانی کردووە.هەروەها لەپێغەمبەریشەوە (ﷺ) سەلمێنراوە ،کەسێدوای سەلماندنی بەڵگە موخالەفەی بکات ئەوا بێ باوەڕ دەبێ بەڵام پێش سەلماندنی ئەوە بیانوی هەیە چونکە نازانێ و زانیاری پێنیە ، چونکەزانیاری دەربارەی ناوسیفەتەکان تەنها بەژیری پەیپێنابرێ، بەبیر کردنەوەو تیاڕامان بەدەست نایەت ئێمە هیچ کەس تەکفیر ناکەین کەزانیاری لەوبابەتە نەبێت، مەگەرکەسێ بەڵگەیپێبگات، ئێمەئەم سیفەتانە دەسەلمێنین ونەفی لەیەکچون لەخوادەکەین وەکوخوای گەورە سەلماندن ونەفیکردووە وەك دەفەرمووێت : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾[11].

دەربارەی قورئانی پیرۆز (البويطی) ئەڵێ گوێم لێ بوو شافعی دەیگوت :خوای گەورە بەووشەی(کن )دروستکراوەکانیبەدیهێناوە ئەگەربێت و(کن) دروستکراوبێت واتە دروستکراوێك بەدروستکراوێکیتر بەدی هاتوە واتە قورئان کەلامی خوایەوە ومەخلوق نیە[12] بینینی خوا بۆئیمانداران لەبەهەشتدا، شافعی خوای لێ ڕازی بێت لە تەفسیری ئایەتی.

﴿كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾[13].

---

[11] {سورة الشورى:١١}.

[12] انظر : حلية الاولياء (١١١/٩).

[13] {سورة المطففين:١٥}.

ئەڵیٚ ئەم ئايەتە بەڵگەيە لەسەر ئەوەموسڵمانان (دۆستەکانی خوا)لەڕۆژی قيامەتدا (واتە لەبەهەشتدا خوا دەبينن.

هاوەڵـان وچـوار خەليفەکـە باشـترين خـەڵك لـەدوای پيٚغەمبـەر صـلی اللـە عليـە وسـلم ئەبوبەکرە پاشان عومەر پاشان عوسمـان پاشـان عـەلی خـوا لەهـەمويان رازی بيٚـت ،خـوای گەورە مەدحی هاوەڵـەکانی پيٚغەمبـەری (ﷺ) لـە قورئانـدا کـردووە،هـەروەها پيٚغەمبـەريش (ﷺ) فەزڵی بیٚ ويٚنەیی‌وگەورەيی ئەوانی بۆ باس کردووين[14]

## شافعی و ئەهلی کەلام

موحەممەدی کوڕی ئيسماعيلی ترمذيی ئەڵیٚ (ابوثور) وحوسيٚنی کـوڕی عـەلی کەڕابيـسی گوتيان : گویٚمان لیٚ بـوو شـافعی دەيگـوت حـوکمی مـن بەرامبـەر بـە ئـەهلی کـەلام ئەوەيـە بە(سەعەف)ی دارخورما لیٚبـدريٚن وبەسـواری ووشـتربەناو خەڵکدا بۆپەنـد بـسوڕيٚنريٚنەوە و پيٚيان بگوتریٚ ئەمە تۆڵەی وازهيٚنانتانە لەقورئان وسونەت)[15]، ڕەبيع ئەڵیٚشافعی گوتی:

گەربيٚتو ئينسان بگاتەوە بـەخوا بـە هـەر تاوانيٚکـەوە بـیٚ تـەنها شـيرك نـەبیٚ ئاسـانترە لەوەی بگاتەوەلای‌خواوهەندیٚ بيدعەی ئەنجام دابیٚ[16].

## شافعی و کارکردن بەحەديس

عەبدوڵلای کوڕی ئيمامی ئەحمـەد ئـەڵیٚ :گـویٚم لـەباوکم بوودەيگـوت شـافعی ووتوويـەتی :ئيٚوە لەحەديسەدا لەئيٚمە شارەزاترن ئەگەر حەديسی صەحيح شارەزا بوون هەواڵم پیٚبدەن تابەدوايدا بڕۆم لەکوفەبیٚ يان لەبەسرەبیٚيان لەشام[17].

(حەرمەلـە) دەڵـیٚ :شـافعی ووتويـەتی :ئـەوەی کـەمن ووتومـە و پيٚـچەوانەی حەديـسی صەحيحی پيٚغەمبەرە، ئەوەحەديس لەپيٚشترە وتەقليدی من مەکەن[18].

ڕەبيع ئەڵیٚ گویٚم لیٚ بووشافعی دەيگووت :ئەگەرلەکتيٚبەکەمـدا شـتيٚکتان بينـی خيلافـی سونەتی پيغەمبەربوو ئيٚوەکاربەسونەتەکە بکەن و ئەوەی‌من ووتومە وازیلیٚبيٚنن[19].

[14] مناقب الشافعي (٤٣٣/١).
[15] سيراعلام النبلاء (٣٩/١٠).
[16] سير اعلام النبلاء (١٦/١٠) تاريخ الاسلام (٣٣١/١٤).
[17] سيراعلام النبلاء (٣٣/١٠).
[18] سير اعلام النبلا ء (٣٣/١٠).

ڕەبیع ئەڵێ پیاوێك گووتی ئەی (ئەبوو عبداللـه ) کاربـه حـەدیس دەکـەی گـوێم لێبـوو گووتی:هەرکاتێك حەدیسێکی صەحیحم لەپێغەمبـەرەوە ڕیوایـەت کردوکـارم پێنـەکرد ئـەوا ئێوە شایەت بن من عەقلم نەماوە . ئەلحومەیدی ئەڵێ ڕۆژێکیان شافعی حەدیسێکی ڕیوایـەت کـرد،منـیش گـوتم :ئایـا کاری پێدەکـەی ؟ئـەویش گـوتی(ئایامنـت لەکڵێـسادا بینیـوە بێمـە دەرەوە یان پشتوێنی گاورت بەپشتمەوە بینیوە ؟گوێم لەحەدیسی پێغەمبـەربێ وکاری پـێ نەکەم !،(ابوثـور) ئـەڵێ شـافعی ئـەڵێ : هەرمەسـەلەیەك حەدیـسی صـەحیحی لای زانایـانی حەدیس لەسەر هاتبێ بەپێچەوانەی ئەوەی من ووتومە ئـەوا مـن لێـی پەشـیمانم لەژیانمـدابێ یان پاش مردنم )[20]، هـەروەها ئـەڵێ(کاتێـك کەسـێك لەئـەهلی حـەدیس ئـەبینم وەکـو وابـێ کەسـێك لـەهاوەڵانی پێغەمبــەر ببیـنم خواپاداشـتی خێریـان بداتـەوە بنـچینەکەیان بۆمـان پاراستوە بۆیە فەزڵیان بەسەرمانەوەهەیە )[21]، شافعی وحەدیسی ئاحادشافعی ئەڵێ(لـەبواری حەدیسدا حەدیسی تەنها پیاوێك یان تەنها ژنێك وەردەگرم بەلآم لە شایەتیدا بەتەنها یەکێك لەوانە وەرنـاگرم لەحەدیـسدا (حـدثني فـلان عـن فـلان) وەردەگـرم بـەلآم لەشـایەتیدا تـەنها (سمعـت ) یـان (اشـهدنی ) وەردەگـرم بازنــەی وەرگرتنــی حەدیـسی ئاحـاد لای شــافعی فـراوانترە– وەکـو بـە راوردێـك لەگـەڵ پێـشەوایانی تـردا – ئیبنولعـەرەبی ئـەڵی (ئەگـەر حەدیسی ئاحاد دژ بە بناغەیەك لەبناغەکانی شەرع بوەستێت ئەبوو حەنیفە بەڕەوای نابینێ ئەوحەدیسە کاری پێبکرێت بەلآم شافعی بەڕەوای دەبینێ)[22] .

## بنچینەکانی مەزهەبی شافعی

ئەساسی مەزهەبی شافعی ڕەحمەتی خوای لێبـێ لـەکتێبی (الرسـالة) دا نوسـراوەتەوە ، شافعی (ظاهر)ی قورئان بەبەڵگە دادەنێ تـاوەکو بەڵگەیـەك ڕاسـتبێتەوە و ئـەوە بگەیـەنێت کە(ظاهر) ی ئایەتەکەی مەبەسـت نیـیە– بەڵگـەی قورئـانی و پـیرۆز وسـوننەتی صـەحیحی پێغەمبەر– ، شافعی دیفاعێکی بەردەوام و نـەبڕاوەی کـردووە لەسـەر کـارکردن بەحەدیـسی ئاحـاد بەمـەرجێك ڕیوایـەتکاری حەدیـسەکەمتمانە پـێ کـراو و (ظـابط) بۆحەدیـسەکەش

---

[19] سيراعلام النبلاء (١٠/٣٤).

[20] اعلام الموقعين (٢/٣٦٣).

[21] اعلام الموقعين (٢/٣٦٣).

[22] انظر : مناهج الاجتهاد (ص١٦٣).

(متصل) بی‌تادەگاتە پێغەمبەر بەبێ ئەومەرجانەی ئیمامی مالیك و ئـەهلی عێـراق دایاننـاوە بۆ وەرگرتنی حەدیس .

ئەم دیفاعەش بووە هۆ کارێك بۆ خۆشەویست کردنی شافعی‌لای ئەهلی حەدیس تەنانەت زانایانی بەغدا پێیان دەگوت (ناصر السنة) شافعی چـۆن دەیڕوانیـە قورئـان بەوشـێوەیەش دەیڕوانیە حەدیسی صەحیح، وای دەبینی کەهەردوك واجبە کاریـان پـێ بکـرێ ئـەنجا دوای قورئان وسوننەت کاری بەئیجماع دەکرد واتاکەشی لای شافعی ئەوەیە

(ئەوکەسەی کاربە ئیجماع دەکـات زانیـاری بـەبوونی جیـاوازی لەوبابەتـەدا نـەبێ) ئـەنجا شافعی ئەگەر لەبابەتێکدا (دەقی) قورئان وسوننەتی دەستنەکەوتایە کـاری بـەقیاس دەکـرد بەمەرجێك ئەصلێکی هەبوایە لەقورئان و سـوننەتدا، شـافعی ئیستحـسان و ئیستیـصلاح) ی ڕەتکردوەتەوەو کاری پێ نەکردوە[٢٣] .

## شافعی وشیعرو ڕەوانبێژی

(ئیبن وهیشام) ئەڵێ زۆر لەگەڵ شافعی پێکەوە دادەنیشتین بەهیچ شێوەیەك هەڵەیـەکم لەزمانی عەرەبیدا لـێ نـەبینیوە[٢٤]، ئەحمـەدی کـوڕی ئـەبو سـورەیجی ڕازی ئـەڵێ (کەسـێکم نەبینیوە قسەزانتر و زمانپاراوتر بێ لە شافعی)[٢٥]،

زوبەیری کوڕی بەککار ئەڵێ(شیعر)ی هذیل و بەسەرهاتی ئەو هۆزەم لـە (مـصعب)ی کـوڕی عەبدوڵاوە وەرگرتووە ئەویش لەشافعی یەوە وەریگرتبوو)، شایانی باسـە شـافعی لـەبواری شیعردا خاوەنی دیوانێکی شیعری یە بەناوی (دیـوان الامـام الـشافعی) کۆکردنـەوەی (محمـد عفیـف الـزعبی) هـەروەها ئـیبن وغـانم ی حـافیزی حـەدیس ئـەڵێ (شـیعرەکانی شـافعیم کۆکردوەتەوە لە دیوانێکدا. بەڵام تائێستا کۆکراوەی یەکەم لەبەردەستی خۆماندایە.

---

23 انظر : تأريخ التشريع الاسلامي(ص١٨٦).

24 انظر : سير أعلام النبلاء (٤٩/١٠).

25 انظر : سير أعلام النبلاء (٤٩/١٠).

## هەندێ لە شیعرە بەنرخەکانی شافعی

## لێبوردەیی ورەوشت جوانی

إذا سبني ندل تزايدت رفعة        ومالعيب إلا أن اكون مسببه
ولولم تكن نفسي علي عزيز        لمكنتها من كل نذل تحاربه
ولوأنني أسعى لنفعي وجدتني        كثيرالتواني للذي أنا طالبه
ولكني أسعى لأنفع صاحبي        وعارعلى الشبعان إن جاع صاحبه
يخاطبني السفيه بكل قبح        فأكره أن أكون له مجيبا
يزيد سفاهة فأزيد حلما كعود زاده الاحراق طيبا
اذا نطق السفيه فلا تجبه فخير من إجابته السكوت
فان كلمته فرجت عنه وإن خليته كمدا يموت[٢٦]
يا من يعانق دنيا لابقاء لها        يمسي ويصبح في دنياه سفارا
هلا تركت لذي الدنيا معانقة        حتى تعانق في الفردوس ابكارا
إن كنت تبغي جنات الخلد تسكنها        فينبغي لك ان لاتامن النارا

## دەربارە ی باشترین زانست

كل العلوم سوى القران مشغلة        إلا الحديث وعلم الفقه في الدين
العلم ماكان فيه قال حدثنا        وما سوى ذاك وسواس الشياطين[٢٧]

هەروەها چەندین پارچە شیعری تەڕ وناسکی تر، بەحەقیقەت شافعی خاوەن توانایەکی شیعری زۆر بەهێز بووە، بەڵام خۆی بەئەنقەست شیعری نەوتووە بەڵکو خۆی بەشرعزانی و زانستە شەرعیەکانەوە خەریك دەکرد، وەکو ئەڵێ :

ولولا الشعر بالعلماء يزري لكنت اليوم اشعر من لبيد[٢٨].

[26] انظر : ديوان الامام الشافعي (ص٢٢).
[27] انظر : ديوان الشافعي (ص٨٨).
[28] انظر : ديوان الشافعي (ص٣٩).

# وتەکانی شافعی

یونسی سەدەفی ئەڵێ:شافعی پێی ووتم: ليس إلیالسلامة من الناس سبيل فانظر الذي فيه صلَاحك فالزمه[٢٩].

شافعی دەڵێ : ضياع العالم أن يكون بلا إخوان وضياع الجاهل قلة عقله واضيع منهما من واخی من لاعقل له[٣٠].

هەروەها دەڵێ : آلات الرياسة خمس : صدق اللهجة ،وكتمان السر والوفاء بالعهد، وابتداء النصيحة ، واداء الامانة[٣١]،

یونسی کوڕی عە بدولئەعلا دەڵێ: گویم لێبوو شافعی دەیگوت:ئەی یونس :الانقباض عن الناس مكسبة للعداوة والانبساط اليهم مجلبة لقرناء السوء فكن بين المنقبض والمنبسط[٣٢]، هەروەها دەڵێ :(عليكم باصحاب الحديث فانهم اكثر جوابا من غيرهم)[٣٣].

ئەگەر بمانەوێ یەك بەیەکی ووتەکانی شافعی لێرەدا تۆمار بکەین ئەوا بێگومان ناتوانین چونکە قسەکانی هەمو پڕ لە حیکمەت وئامۆژگاری وزانستن ، بۆیە قایل دەبین بەمانەی کەباسکران ومشتێك نمونەی خەروارێکە.

# نەخۆشی و مردنی شافعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ

شافعی لە میسر لە درێژەی ئەو چوارساڵەی لە میسردا مایەوە توشی نەخۆشیبوو ، لەماڵدا دەمایەوە و لەسەرجێگا دەکەوت قوتابییەکی بەناوبانگی بەناوی (المزني) ڕۆژێکیان ڕۆشت بۆلای و چوە ژورەوە و پێی گوت ئەمڕۆ چۆنی شافعیش گوتی:

أصبحت من الدنيا راحلا وللاخواني مفارقا

و لكأس المنية شاربا وعلى الله جل ذكره واردا

ولا والله ما أدري روحي تصير الى الجنة فأهنئها او الى النار فاعزيها

---

[29] انظر : سير اعلام النبلاء (٤٢/١٠).

[30] انظر : سير اعلام النبلاء (٤٢/١٠).

[31] انظر : سير اعلام النبلاء (٤٨/١٠).

[32] انظر : سير اعلام النبلاء (٨٩/١٠).

[33] انظر : توالي التأسيس (ص١١٠).

ثم بكى وأنشا :

ولما قسا قلبي وضاقت مذاهبي　　جعلت الرجا مني لعفوك سلما
تعاظمت ذنبي فلما قرنته　　بعفوك ربي كان عفوك اعظما
ومازالت ذاعفو عن الذنبي لم تزل　　تجود وتعفو منه وتكرما[٣٤].

شافعی لە شەوی جومعەی ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەجەبی ساڵی (٢٠٤) ی کۆچی بەرامبەر (١٩ ی) کانوونی دووە می ساڵی (٨٢٠) ی زاینی کۆچی دوایی کردووە ڕەحمەتی خوای لێ بێ ،مردنی شافعی لەوەرزی زستانابووە ولە ڕۆژی جومعە نێژراوەو (٥٤ ) ساڵ تەمەنی کردووە تەرمەکەی بەسەرشان بەڕێخراوە لە(فسطاط) ەوە تاوەکو گۆڕستانی ( بنو زهرة) بەگۆڕستانی (ابن عبد الحكم) بەناوبانگە، ئابەم شێوەیە ئەستێرەی پرشنگداری شافعی لەم دونیایەدا ئاوابوو بەلأم چەندین ڕوناکی و دانایی سودبەخشی کەم وێنەی بۆ بەجێ هێشتوین، ڕەحمەتی خوای لێ بێ و خوا پاداشتی خێری بداتەوە .

خوێنەری بەڕێزم ئەمە کورتەیەك بوو لەژیاننامەی مامۆستای شەرعزان و یەکێك لەناودارانی ئیسلام (شافعی) بۆ هەموو لایەکمان دەرکەوت کە شافعی چ جۆرە بیرۆباوەڕو خووڕەوشت و زانستێکی هەبووە هەروەها هەڵویستی شافعیمان بۆ ڕون بووەوە دەربارەی کارکردن بە حەدیس.

وە هەڵگرانی حەدیس لای شافعی چ ڕێزو حورمەتێکیان هەبوو لەگەڵ چەندین ڕاوبۆچونی دروستی تر کە لەم کورتەیەدا تۆمار کراوە .

=====================================

## سەرچاوەکان


١ -سير اعلام النبلاء /الذهبي
٢ -تاريخ الاسلام /الذهبي
٣-توالي التاسيس /ابن حجر
٤-البداية والنهاية/ابن كثير
٥-تهذيب الكمال/المزي
٦- الجرح والتعديل/لابن ابي حاتم
٧-مناهج الاجتهاد/محمد سلام
٨-ديوان الشافعي
٩- تاريخ التشريع الاسلامي/الخضري.
١٠-مجمل اعتقاد ائمة السلف/ د. عبدالكريم التركي


[34] صفوة الصفة (١٤٦/٢).